# الْأَرْبَعُونَ الْبُخَارِيَّةُ

## فِي الإيمان والأحكام والأخلاق

## بە كوردی

داناني

الشيخ حسن الحسيني

وەرگێڕانی

م. باوكی هاجەرە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: الأَرْبَعُونَ البُخارِيَّةُ في الإيمان والأحكام والأخلاق

داناني: الشيخ حسن الحسيني

وەرگێڕانی: باوکی هاجەرە

نەخشەسازی بەرگ: ابوعمرو

نەخشەسازی ناوەوە: ابوعمرو

## فەرموودەی ١

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ** ﴾

### واتای وشەکان

**إِنَّمَا** = أَدَاةُ الحَصْرِ

بۆ حەصری موبتەدایە لە خەبەر دا، واتە ئەو موبتەدایە بونی هەیە بەو خەبەرەوە

**إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ** = دروستییەتی و تەواوییەتی کردەوەکان تەنهاو بەس بە نییەتە، ئەگەر کردەوەکان نییەتی لەگەڵ نەبوو هیچ سوودێکی نییە

**الأَعْمَالُ** = کردەوەکان،، کۆی(**عَمَل**) ە = کردەوە

**بِالنِّيَّاتِ** = بەنیەتەکانە ، بەنیازی دڵەکانە،، کۆی( **نِيَّة** ) یە = مەبەست و نیاز

**لِكُلِّ امْرِئٍ** = بۆ هەموو کەسێك

**مَا نَوَى** = ئەوەی بۆ دەنوسرێ کەنیەتی بۆی هەیە

**فَمَنْ** = جا هەرکەسێك

**كَانَتْ** = بوو

**هِجْرَتُهُ** = کۆچ کردنەکەی

**إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ** = بۆلای اللّٰه و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم

**فَهِجْرَتُهُ** = ئەوە کۆچ کردنەکەی

**إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ** = بۆ لای الله و پێغەمبەرەکەیەتی صلى الله عليه وسلم

**وَمَنْ** = وە هەرکەسێک

**كَانَتْ** = بوو

**هِجْرَتُهُ** = کۆچ کردنەکەی

**إِلَى دُنْيَا** = بۆلای دونیا

**يُصِيبُهَا** = بەدەستی بێنێت

**أَوْ** = یان

**إِلَى امْرَأَةٍ** = بۆ لای ئافرەتێک

**يَنْكِحُهَا** = مارەی بکات

**فَهِجْرَتُهُ** = ئەوا کۆچ کردنەکەی

**إِلَى** = بۆلای

**مَا** = ئەوەیە

**هَاجَرَإِلَيْهِ** = کە کۆچی کردووە بۆی

## و اتای فەرموودەکە

هەمـــوو کردەوەکـــان بەپێـی نیەتەکـــانە (بەپێـی نـــیەت وەردەگیرێت)هەرکەسێك لەکردەوەکانیدا چ نیازو نیەتێکی هەبێت هەر ئەوەی بۆ دەنوسرێت,جا هەر کەسێك کۆچ بکات بۆلای اللَّه و پێغەمبەرەکەی صلى الله علیه وسلم,ئەوا کۆچەکەی بۆ لای **اللَّه تَعَالَى** و پێغبەرەکەیەتی صلى الله علیه وسلم, وە هەر کەسێك بۆ دونیا کۆچ بکات بۆ ئەوەی بەدەستی بهێنێت, یان بۆ ئافرەتێک تاوەکوو مارەی بکات,

ئەوا کۆچەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆلای کردووە






قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا مُؤْمِنٌ ﴾

## واتای وشەکان

**لَا يَدْخُلُ** = ناچێتە ناو

**الْجَنَّةَ** = بەهەشت

**إِلَّا مُؤْمِنٌ** = جگە لە بڕوادار

## واتای فەرموودەکە

هیچ کەسێک ناچێتە بەهەشت بێجگە لە بڕوادار ( کەسی کافر و موشریک و هەڵگەڕاوە لەدین) ناچنە بەهەشتەوە






قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾**

## واتای وشەکان

**إِنَّ** = بەڕاستی، بێگومان

**لِلَّهِ** = بۆ **اللَّهُ تَعَالَى** هەیە

**تِسْعَةً وَتِسْعِينَ** = نەوەد و نۆ

**اسْمًا** = ناو

**مَنْ** = هەرکەسێك

**أَحْصَاهَا** = ژماردنی، سەرژمێری کردن

**دَخَلَ الْجَنَّةَ** = دەچێتە بەهەشت

**دَخَلَ** = چووە ناو

## و اتای فەرموودەکە

**اللّهُ تَعَالَى** نەوەد و نۆ ناوی هەیە، هەرکەسێك سەرژمێریان بكات دەچێتە بەهەشتەوە

- کەدەڵێت ژماردنی و سەرژمێری کردن واتا

لەبەری کردن و واتاکانیانی زانی وە لە **اللّهُ تَعَالَى** پاڕایەوە پێیان ، بۆ نموونە بڵێ ( **یا غفوریا رحیم** ) وە عیبادەت و پەرستشی کرد بۆ **اللّهُ تَعَالَى** بەگوێرەی داخوازییەکانیان





## فەرموودەی ٤

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾**

**واتای وشەکان**

**لَا يُؤْمِنُ** = بڕوا ناهێنێت

**أَحَدُكُمْ** = یەک لەئێوە

**حَتَّى** = تاوەکوو

**أَكُونَ** = دەبم

**أَحَبَّ** = خۆشەویستر

**إِلَيْهِ** = لەلای

**مِنْ** = له

**وَالِدِهِ** = باوکی ( باوک و دایک )

**وَلَدِهِ** = منداڵی ( کوڕ و کچ )



**وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ** = هەموو خەڵکی

**النَّاسِ** = خەڵکی

**أَجْمَعِينَ** = هەموو، تێکڕا، گشتی

## واتای فەرموودەکە

بڕوای نەهێناوە هیچ یەکێک لە ئێوە تاوەکوو خۆشەویستر دەبم لەلای لە باوک و دایکی و کوڕو کچی و هەموو خەڵکی بەگشتی






قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْلِيَصْمُتْ ﴾

## واتای وشەکان

مَنْ = هەرکەسێك

كَانَ = بوو

حَالِفًا = سوێندخۆر

كَانَ حَالِفًا = سوێندخۆر بوو ( سوێندی دەخوارد )

فَلْيَحْلِفْ = با سوێند بخوات

بِاللَّهِ = بە **اللَّهُ تَعَالَى**

أَوْ = یان

لِيَصْمُتْ = بێدەنگ بێت

## واتای فەرموودەکە

هەرکەسێک ویستی سوێند بخوات با سوێند بخوات بە **اللَّهُ تَعَالَى** یان بێدەنگ بێت و سوێند نەخوات






قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ** ﴾(مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ)

## واتای وشەکان

**مَنْ** = هەرکەسێك

**يُرِدِ** = بییەوێت، دەیەوێت

**اللَّهُ** = **اللَّهُ تَعاَلَى**

**بِهِ** = بەو، بۆ ئەوکەسە

**خَيْرًا** = خێر و چاکە

**يُفَقِّهْهُ** = تێیدەگەیەنیت، شارەزای دەکات

**فِي الدِّينِ** = لە دین (دینی ئیسلام)

## واتای فەرموودەکە

هەرکەسێک **اللَّهُ تَعَالَى** خێر و چاکەی بۆی بوێت ئەوە لەدینی ئیسلام تێیدەگەیەنێت و شارەزای دەکات





## فەرموودەی ٧

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً﴾

## واتای وشەکان

بَلِّغُوا = بگەیەنن ، ڕابگەیەنن

عَنِّي = لەمنەوە

وَلَوْ = ئەگەر

آيَةً = ئایەتێک

وَلَوْ آيَةً = ئەگەر ئایەتێکیش بێت

## واتای فەرموودەکە

بگەیەنن لەمنەوە ئەگەر ئایەتێکیش بێت

📖 ئەو ئـایەتەی یـان ئەو فەرمـوودەیەی دەیزانـی ڕایـبگەیەنەو دەعوەی پێ بکە



## فەرموودەی ٨

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَ إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَ إِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ ﴾

## واتای وشەکان

بُنِيَ = بونیادنراوە، دروست کراوە

الْإِسْلَامِ = ئایینی ئیسلام

عَلَى = لەسەر

خَمْسٍ = پێنج شت، پێنج کۆڵەگەو ڕوکن

شَهَادَةِ = شایەتیدان، شایەتمانی

لَا = نیە

إِلَهَ = پەرستراو، مَعْبُود

إِلَّا اللَّهُ = بێجگە لە اللَّهُ تَعَالَى

وَأَنَّ = وە بێگومان



**مُحَمَّدًا** = پێغەمبەر موحەممەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**رَسُولُ اللَّهِ** = نێردراوی **اللَّهُ تَعَالَى** یە

**وَ إِقَامِ الصَّلَاةِ** = وە جێبەجێ كردن و بەرپاكردنی نوێژ

**وَ إِيتَاءِ الزَّكَاةِ** = وە بەخشین و پێدانی زەكات

**وَالْحَجِّ** = وە حەجكردن

**وَصَوْمِ رَمَضَانَ** = وە بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزان

## و اتای فەرموودەكە

ئـاییني ئیسـلام بونیـادنراوە لەسـەر پێـنج كـۆڵەگەو پـایە، شـایەتی دان كەهـیچ پەرسـتراوێك نیـیە بەحەق و ڕاسـتی بـێجگە لە **اللَّهُ تَعَـالَى**، وە مـوحەممەد پێغەمـبەری **اللَّهُ تَعَـالَى** یـە، وە ڕاگـرتن و ئەنجامـدانی نـوێژ، وە دانی زەكات وە حەج كردن وە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان





## فەرموودەی ٩

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ** ﴾

**أَيْ** أَحْدَثَ حَدَثَاً مِثْلُ البَوْلِ والغائِطِ والرِّيحِ والنَّوْمِ

## واتای وشەکان

**لَا تُقْبَلُ** = قەبووڵ ناکرێت، وەرناگیرێت

**صَلَاةُ** = نوێژی

**مَنْ** = هەرکەسێك، ئەو کەسەی

**أَحْدَثَ** = ڕووی دا، دایهێنا ( شتێکی لێ بەربوو ) دەست نوێژی شکا

**حَتَّى** = هەتا، تاوەکوو

**يَتَوَضَّأَ** = دەست نوێژ هەڵدەگرێت



## و اتاى فەرموودەكە

نـوێژى هـيچ كەسـێک وەرناگيرێـت كە شـتێكى لێى ڕوودا ( لێى بەربوو ) تا دەست نوێژ هەڵدەگرێتەوە

**أَحْدَثَ حَدَثَاً** = ڕووداوێک ڕوبدات

**مِثْلُ** = وەكوو

**البَوْلِ** = ميز

**الغائِطِ** = پيسايى

**الرِّيحِ** = با

**النَّوْمِ** = نوستن

## فەرموودەی ١٠

عَـنْ عَـائِشَـةَ قَـالَـتْ ﴿ **كَانَ النَّبِيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يُعْجِبُـهُ التَّـيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِـهِ، وَتَرَجُّلِـهِ، وَطُهُـورِهِ فِي شَـأْنِهِ كُلِّهِ** ﴾

## واتای وشەکان

**كَانَ** = بوو

**النَّبِيُّ** = پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**يُعْجِبُـهُ** = سەرسـامی دەکـرد، حەزی پـێ دەکـرد پێغەمـبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**التَّيَمُّنُ** = بە دەست پێکردن بەلای ڕاستە

**فِي** = لە

**تَنَعُّلِهِ** = نەعل لە پێکردنی

**وَتَرَجُّلِهِ** = وە لەپرچ داهێنانی



**وَطُهُورِهِ** = وه له خۆ پاككردنهوه و دهست نوێژ ههڵدهگرتن دا

**فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ** = له ههموو شتهكانی تری دا

## واتای فهرمووده‌كه

پێغهمبهر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی خۆش بوو و حهزی دهكرد له لای ڕاسته دهست پێ بكات له نهعل له پێكردنی و پرچ داهێنانی و خۆ پاككردنهوهو دهست نوێژ و ههموو شتهكانی تری دا



## فەرموودەی ١١

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ ﴾

**واتای وشەکان**

إذا = ئەگەر

سَمِعْتُمُ = گوێتان لێ بوو

النِّدَاءَ = بانگ

سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ = گوێتان لە بانگ بوو

فَقُولُوا = بڵێن

مِثْلَ = وەکوو

ما = ئەوەی

يَقُولُ = دەڵێت

الْمُؤَذِّنُ = بانگدەر

## واتای فەرموودەکە

ئەگەر گوێتـان لـە بانـگ بـوو، بڵـێن وەکـوو ئەوەی بانـگ دەر دەیڵێت.

- بـۆ نمونـە ( ئەگەر وتـی الله أکبر الله أکبر ئێـوەش بڵـێن الله أکبر الله أکبر ........ هتد، جگە لە حي على الصلاة و حي على الفلاح لەم دووەیان بڵێن لا حول ولا قوة الا بالله ).



## فەرموودەی ١٢

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي ﴾

### واتای وشەکان

صَلُّوا = نوێژ بکەن

كَمَا = وەکوو ئەوەی

رَأَيْتُمُونِي = منتان بینیوە

أُصَلِّي = نوێژ دەکەم

### واتای فەرموودەکە

نوێژ بکەن هەروەک چۆن منتان بینیوە نوێژ دەکەم

## فەرموودەی ١٣

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ** ﴾

## واتای وشەکان

**لَا صَلَاةَ** = نوێژ نیە، نوێژ دروست نیە

**لِمَنْ** = بۆ ئەوکەسەی

**لَمْ يَقْرَأْ** = نەیخوێندۆتەوە

**بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ** = فاتیحەی کتاب سورەتی فاتیحە

## واتای فەرموودەکە

نـــوێژی ئەو کەســـەی دروســـت نـــیە ســـورەتی فـــاتیحەی نەخوێنێتەوە

 ســـورِەتی فـــاتیحە دەبێــت لەهەمـــوو ڕکاتێــک دا بخوێنـدرێت، هەرکەسێك نەیخوێنێت نـوێژەکەی بەتـاڵە، بەس ئەگەر بەجەمـاعەت نـوێژەکەی کـرد ئەوا پێویســت ناکات ئەوانەی دوای ئیمـام سـوڕەتی فـاتیحەی بخـوێنن لە نــوێژی بەیــانی و 2 ڕکــاتی ســەرەتای مەغریــب و 2 ڕکــاتی سەرەتای عیشا



## فەرموودەی ١٤

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً ﴾

**واتای وشەکان**

**صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ** = نوێژی کۆمەڵ، نوێژی جەماعەت

**تَفْضُلُ** = گەورەتر و چاکتر دەبێت

**صَلَاةَ الْفَذِّ** = لە نوێژی تاک لە نوێژی بەتەنها

**بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ** = بە بیست و حەوت

**دَرَجَةً** = دەرەجە، پلە

**واتای فەرموودەکە** نوێژی بەکۆمەڵ باشتر و گەورەترە لە نوێژی تاك بە بیست و حەوت پلە

📖 بیست و حەوت نوێژ بە تەنها بکەی ناگات بەیەک نوێژ بەکۆمەڵ و جەماعەت بیکەیت



## فەرموودەی ١٥

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ مَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الْأَقْصَى، وَمَسْجِدِي هَذَا ﴾

## و اتای وشەکان

لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ = سەفەر ناکرێ، بارگەی سەفەر تێک نانرێت

إِلَّا = جگە، مەگەر

إِلَى = بۆ

ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ = سێ مزگەوتان

مَسْجِدِ الْحَرَامِ = مزگەوتی حەرام (لە مەککە)

مَسْجِدِ الْأَقْصَى = مزگەوتی ئەقصا

مَسْجِدِي هَذَا = ئەو مزگەوتەی من (مزگەوتی پێغەمبەر)

## **واتای فەرموودەکە**

سـەفەر نـاکرێ ( بـۆ هـیچ شـوێنێك بە مەبەسـتی پیـرۆزی شـوێنەکە) تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێـت ، مزگەوتی حەڕام لە مەکـــکە،، وە مزگەوتـــی ئەقصـــا لە قـــودس وە ئەو مزگەوتەی من لە مەدینە دا.



## فەرموودەی ١٦

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ ﴾

### واتای وشەکان

إِذَا = ئەگەر

دَخَلَ = داخیل بوو ( هات )

رَمَضَانُ = مانگی ڕەمەزان

فُتِّحَتْ = دەکرێتەوە

أَبْوَابُ = دەرگاکانی

الْجَنَّةِ = بەهەشت

غُلِّقَتْ = قەپات دەکرێت

أَبْوَابُ = دەرگاکانی

**جَهَنَّمَ** = دۆزەخ

**وَسُلْسِلَتِ** = وە زنجیر دەكرێت

**الشَّيَاطِينِ** = شەیتانەكان

## و اتای فەرموودەكە

ئەگەر مـــانگی ڕەمەزان هـــات دەرگایەكـــانی بەهەشـــت دەكـرێنەوە و دەرگایەكانی دۆزەخ دادەخـرێن و شـەیتانەكان زنجیر دەكرێن

## فەرموودەی ١٧

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

﴿ أَوْصَانِي خَلِيلِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِثَلَاثٍ ؛ صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ ﴾

**و اتای وشەکان**

أَوْصَانِي = وەسیەت و ئەمۆژگاری کردم

خَلِيلِي = خۆشەویستم (پێغەمبەر) صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

بِثَلَاثٍ = بەسێ شت

صِيَامِ = بەڕۆژی بوونی

ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ = سێ ڕۆژان

مِنْ = له

كُلِّ = هەموو



شَهْرٍ = مانگێک

وَرَكْعَتَيْ = وە دوو ڕکاتی

الضُّحَى = چێشتەنگاو

وَأَنْ أُوتِرَ = وە ویتر بکەم

قَبْلَ = پێش

أَنْ أَنَامَ = بنووم

## واتای فەرموودەکە

وەسیەتی کردم خۆشەویستەکەم بەسێ شت،بە بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک، وە کردنی دوو ڕکاتی چێشتەنگاو، وە ویتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم



## فەرموودەی ١٨

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُرَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ، مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ ﴾

### واتای وشەکان

**مَثَلُ** = نمونە و وێنەی

**الذي** = ئەوەی، ئەوکەسەی

**يَذْكُرُرَبَّهُ** = ذکرو باسی پەروەردیگاری دەکات

**والذي** = وەئەوەی ، ئەوکەسەی

**لا يَذْكُرُ** = ذکرو یادی **اللَّهُ تَعَالَى** ناکات

**مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ** = وەکو زیندوو و مردوو وانە

**الحَيّ** = زیندوو

**المَيِّت** = مردوو

### واتای فەرموودەکە

ئەوکەسەی زیکر و یادی پەروەردیگاری دەکات، وەئەو کەسەی زیکرو یادی ناکات وەکو زیندوو و مردوو وانە



## فەرموودەی ١٩

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ خَيْرُكُمْ مَنْ تَعلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ ﴾

### واتای وشەکان

خَيْرُكُمْ = باشترینتان، باشترین کەستان

مَنْ = ئەو کەسەیە

تَعلَّمَ الْقُرْآنَ = خۆی فێرە قورئان کردووە

وَعلَّمَهُ = وەخەڵکیشی فێرکردووە

### واتای فەرموودەکە

باشترین کەستان ئەو کەسەیە کەوا خۆی فێرە قورئان کردووەو خەڵکیش فێرە قورئان دەکات



## فەرموودەی ٢٠

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ : سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ** ﴾

**واتای وشەکان**

**كَلِمَتَانِ** = دوو وشە {دوو وشە هەنە}

**خَفِيفَتَانِ** = سوک و ئاسانن

**عَلَى اللِّسَانِ** = لەسەر زمان

**ثَقِيلَتَانِ** = قورس و گرانن

**فِي الْمِيزَانِ** = لەتەرازوودا

**حَبِيبَتَانِ** = خۆشەویستن

**إِلَى الرَّحْمَنِ** = لەلای **اللَّهُ تَعَالَى**



**سُــبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْــدِهِ** = پــاكى و بــێگەردى و ســوپاس و ستایش بۆ **اللَّهُ تَعَالَى**

**سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ** = پاكى و بێگەردى بۆ اللَّه ى گەورە

## **واتای فەرموودەكە**

دوو وشــە هەنە ســوك و ئاســانن لەســەر زمــان، قــورس و گرانن لەتەرازوودا، خۆشەویستن لە لای **اللَّهُ تَعَالَى**، ئەویش بریتیین لە سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ

## فەرموودەی ٢١

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ أَحْسَنَكُمْ أَخْلَاقًا ﴾

### واتای وشەکان

إِنَّ = بەڕاستی، بێگومان

مِنْ = لە

أَحَبِّكُمْ = خۆشەویسترینتان

إِلَيَّ = لەلای من

أَحْسَنَكُمْ = باشترین و چاکترینتانە

أَخْلَاقًا = لە ڕەوشت و ئەخلاق

### واتای فەرموودەکە

بێگوومان خۆشەویست ترینتان لەلای من باشترینتانە لە خورەوشت دا( خۆشەویسترین کەس لە لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەو کەسەیە کە جوانترین و باشترین ڕەوشت و ئاکاری هەیە)

## فەرموودەی ٢٢

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ** ﴾

### و اتای وشەکان

**كُلُّ** = هەموو

**مَعْرُوفٍ** = چاکەیەک ( ناوە بۆ هەموو کارێکی چاک و باش )

**صَدَقَةٌ** = خێرە ( پاداشتی لەسەرە )

### و اتای فەرموودەکە

هەموو چاکەیەک خێرە و پاداشتی لەسەرە

# فەرموودەی ٢٣

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ ﴾

## و اتای وشەکان

الْكَلِمَةُ = وشەية

الطَّيِّبَةُ = چاک و باش

صَدَقَةٌ = خێرە و پاداشتی لەسەرە

## و اتای فەرموودەکە

وشەی چاک و باش خێرە و پاداشتی لەسەرە



## فەرموودەی ٢٤

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ ﴾

### واتای وشەکان

الْمُسْلِمُ = مسوڵمان

مَنْ = ئەو کەسەیە، کەسێکە

سَلِمَ = سەلامەتە

الْمُسْلِمُونَ = مسوڵمانان

مِنْ = لە

لِسَانِهِ = زمانی، زمانی ئەوکەسە

وَيَدِهِ = وە لەدەستی، لەدەستی ئەو کەسە

### واتای فەرموودەکە

مرۆڤی مسوڵمان ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەتبن

بەڵام بەداخەوە بـــاوەڕ نـــاکەم هـــیچ مســـوڵمانێک لەزمانی مسوڵمانان سەلامەت بێت لەم سەردەمەدا ، کا کێ لەئێمە سەلامەتە و دڵنیایە کە ( غەیبەت نەکرێت، بوختانی پێ نەکرێت، قسەی ناشیرینی پێ نەوترێت....هتد)

**قالَ ابْنُ دُرَيْدِ الأَزْدي**

وَمَا أَحَدٌ مِنْ أَلْسُنِ النَّاسِ سَالِمَا

وَلَوْ أَنَّهُ ذاكَ النَّبِيُّ المُطَهَّرُ

فَإِنْ كانَ مِقْداماً يَقُولُونَ أَهْوَجُ

وَإِنْ كانَ مِفْضالاً يَقُولُونَ مُبَذِّرُ

وَإِنْ كانَ سِكّيتاً يَقُولُونَ أَبْكَمُ

وَإِنْ كانَ مِنْطِيقاً يَقَولُونَ مِهْذَرُ

وَإِنْ كانَ صَوّاماً وَبِاللَّيْلِ قائِماً

يَقُولُونَ زَرّافٌ يُرائِي وَيَمكُرُ

فَلا تَحْتَفِلْ بِالنَّاسِ في الذَّمِّ وَالثَّنا

وَلا تَخْشَ غَيْرَ اللَّهِ فَاللَّهُ أَكْبَرُ



## فەرموودەی ٢٥

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ ﴾

## واتای وشەکان

لَا يُؤْمِنُ = بڕوا ناهێنێت، ئیمان ناهێنێت

أَحَدُكُمْ = یەکێک لە ئێوە

حَتَّى = هەتا، تاوەکوو

يُحِبَّ = پێی خۆش بێت

لِأَخِيهِ = بۆ برایەکەی

مَا = ئەوەی

يُحِبُّ = پێی خۆشە

لِنَفْسِهِ = بۆخۆی

## واتای فەرموودەکە

بـڕوای تەواوی نەهێنـاوە هـیچ کەسـێک لە ئێـوە تـا ئەوەی بۆخۆی پێی خۆشە بۆ برایەکەشی پێی خۆش نەبێت



## فەرموودەی ٢٦

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ لَا يَرْحَمُ اللَّهُ مَنْ لَا يَرْحَمُ النَّاسَ ﴾

### واتای وشەکان

لَا يَرْحَمُ = ڕەحم ناکات

اللَّهُ = اللَّهُ تَعاَلَى

مَنْ = بەو کەسەی

لَا يَرْحَمُ = ڕەحم ناکات

النَّاسَ = بەخەڵکی

### واتای فەرموودەکە

**اللَّهُ تَعَالَى** ڕەحم بەو کەسەی ناکات کە ڕەحم بەخەڵکی ناکات





## فەرموودەی ٢٧

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿ آيَـةُ الْمُنَـافِقِ ثَـلَاثٌ : إِذَا حَـدَّثَ كَـذَبَ، وَإِذَا وَعَـدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ ﴾**

### واتای وشەکان

**آيَةُ** = نیشانە

**المُنافِقِ** = دووڕوو

**ثَلاثٌ** = سێنە

**إِذَا** = ئەگەر

**حَدَّثَ** = قسەی کرد

**كَذَبَ** = درۆی دەکات

**وَإِذَا** = وەئەگەر

**وَعَدَ** = بەڵێنی دا

**أَخْلَفَ** = پێچەوانەی دەکات، سەرپێچی دەکات

**وَإِذَا** = وه ئه‌گه‌ر

**اؤْتُمِنَ** = به ئه‌مين داندرا

**خَانَ** = خيانه‌ت ده‌كات، ناپاكى ده‌كات

## **و اتاى فه‌رمووده‌كه**

نيشـانه‌ى كه‌سى دووڕوو سێ شـته ، ئه‌گه‌ر قسـه‌ى كـرد درۆ ده‌كات، ئه‌گه‌ر به‌ڵێنى دا سـه‌رپێچى ده‌كات، ئه‌گه‌ر ئه‌مانه‌تى لا داندارا ناپاكى و خيانه‌ت ده‌كات



## فەرموودەی ٢٨

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ ﴾

**واتای وشەکان**

**لا يَدْخُلُ** = ناچێتە ناو

**الْجَنَّةَ** = بەهەشت

**قَتَّاتٌ** = قسەهێنەر و قسەبەر، دوزمانی کەر، یان ئەو کەسەی گوێ لە قسەی خەڵکی دەگرێت و پاشان بڵاوی دەکاتەوە

**واتای فەرموودەکە**

ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دەبا و دەهێنێت

📖 واتا دوای عەزاب و سزا ئینجا دەچێتە بەهەشت



## فەرموودەی ٢٩

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَفِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا، فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ** ﴾

## واتای وشەکان

**دَخَلَتِ** = چووە ناو، داخیل بوو

**امْرَأَةٌ** = ئافرەتێک

**النَّارَ** = ئاگر

**دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ** = ئافرەتێک چووە ناو ئاگری دۆزەخ

**فِي** = بەهۆی، بەهۆکاری

**هِرَّةٍ** = پشیلەیەکی مێیینە

**رَبَطَتْ** = بەستییەوە

**هَا** = پشیلەکە

**رَبَطَتْهَا** = پشیلەکەی بەستەوە

**فَلَمْ تُطْعِمْهَا** = خواردنی بە پشیلەکە نەدەدا

**وَلَـمْ تَـدَعْهَا** = وەلێشـی نەدەگەڕا، وازیشـی نەدەهێنـا لە پشیلەکە

**تَأْكُلُ** = بخوات { پشیلەکە }

**مِنْ** = لە

**خَشَاشِ** = مێرو گیانەوەرو حەشەڕات

**الْأَرْضِ** = زەوی

## واتای فەرموودەکە

ئافرەتێـک چـووە نـاو ئـاگری دۆزەخەوە بەهـۆی ئەوەی پشـیلەیەکی بەسـتبۆوە و خواردنیشـی پـێ نەدەدا و لێشـی نەدەگەڕا لە حەشـەڕات و گیـانەوەری زەوی بخـوات { ئەوە حاڵی ئەو پشیلە بەستەزمانە بوو هەتا مرد }

📖 ئافرەتێک چووە دۆزەخەوە لەبەر گرتنی یەک پشیلە، ئەی ئەوانەی کە ئێستا بەهەزارەها مسوڵمان دەگرن دەبێت حاڵیان چۆن بێت لە قیامەت دا

## فەرموودەی ٣٠

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**﴿ يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ ﴾**

### واتای وشەکان

يُسَلِّمُ = سەلام دەکات

الصَّغِيرُ = بچووک

عَلَى = لەسەر

الْكَبِيرِ = گەورە

وَالْمَارُّ = ڕۆیشتوو، تێپەڕیو

عَلَى = لەسەر

الْقَاعِدِ = دانیشتوو

وَالْقَلِيلُ = کەم

عَلَى = لەسەر



**الْكَثِيرِ** = زۆر

## و اتای فەرموودەکە

بچووک سەلام لە گەورە دەکات، کەسی ڕۆیشتوو سەلام لە دانیشتوو دەکات، خەڵکی کەم سەلام لە خەڵکی زۆر دەکات



## فەرموودەی ٣١

عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ يَا غُلَامُ، سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ ﴾

## واتای وشەکان

**يَا** = ئەی

**غُلَامُ** = منداڵ ( ناوە بۆ منداڵێکی لەدایک بوو تا باڵغ دەبێت)

**سَمِّ اللَّهَ** = بِسْمِ اللَّه بکە، ناوی **اللَّهُ تَعَالَى** بهێنە

**كُلْ** = بخۆ

**بِيَمِينِكَ** = بەدەستە ڕاستەت

**وَكُلْ** = وە بخۆ

**مِمَّا** = لەوەی

**يَلِيكَ** = لەلای خۆتە، لە پێش خۆتە



## و اتای فەرموودەکە

عومەری کوڕی باوکی سەلەمە دەفەرموێت، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی فەرمووم ( ئەی منداڵ ناوی **اللَّهُ تَعَالَى** بهێنە، وە بەدەستی ڕاستت بخۆ، وە لەپێشە خۆتەوە بخۆ )

سێ ڕوون کردنەوە

1 ــــ نەوەوی دەڵێت بە کۆدەنگی هەموو زانایان بِسْمِ اللَّهِ کردن لەپێش نان خواردن سوننەتە، بەڵام وانییە بەڵکو کۆمەڵێک لەزانایان دەفەرموون واجبە، وە پێشەوا شافیعی لە کتابی ( الأُمّ و الرسالة ) دا دەفەرموێت واجبە بِسْمِ اللَّه بکرێت

2 ــــ واجبە بەدەستی ڕاستت بخۆی چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمانی کردووە لەم فەرموودەیە و لەفەرموودەیەکی تری صەحیح دا ( أَنَّ رَجُلًا أَكَلَ عِنْدَ رَسُولِ

اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشِمَالِهِ، فَقَالَ : كُلْ بِيَمِينِكَ، قَالَ : لَا أَسْتَطِيعُ. قَالَ : لَا اسْتَطَعْتَ، مَا مَنَعَهُ إِلَّا الْكِبْرُ ) رواهُ مُسْلِمٌ،،، وه پێغهمبهر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قهدهغهى كردووه بهدهستى چهپ بخۆين چونكه شهيتان بهدهستى چهپى دهخوات، ههروهك فهرموويهتى ( لَا تَأْكُلُوا بِالشِّمَالِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِالشِّمَالِ ) رواهُ مُسْلِمٌ

3 ـــ پێغهمبهر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فهرمانى كردووه كه لهپێشهوهى خۆت بخۆى بۆيه پێشهوا شافيعى دهفهرموێت ئهگهر كهسێک لهپێشهوهى خۆى نهيخوارد وه ئاگاداريش بێت كه پێغهمبهر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ باسى كردووه ئهوه سهرپێچى كردووهو تاوانباره ( وتعقبه تاج الدين السبكي في شرحه بأن الشافعي نص في غير موضع على أن من أكل مما لا يليه عالما بالنهي كان عاصيا آثما) فتح الباري لابن حجر

## فەرموودەی ٣٢

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ

﴿ **مَا عَابَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ** ﴾

### واتای وشەکان

**مَا عَابَ** = عەیبی نەگرتووە، ڕەخنەی نەگرتووە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**طَعَامًا** = لە خواردن

**قَطُّ** = هەرگیز

**إِنْ** = ئەگەر

**اشْتَهَاهُ** = ئارەزووی خواردنەکەی بکردایە

**أَكَلَهُ** = خواردنەکەی دەخوارد

**وَإِنْ** = وە ئەگەر

**كَرِهَهُ** = حەزی بەخواردنەکە نەکردایە، پێی خۆش نەبوایە

**تَرَكَهُ** = وازی لە خواردنەکە دەهێنا

کۆتـا پیتی ئەم چـوار وشـەیە ( اشْـتَهَاهُ، أَكَلَـه، كَرِهَـهُ، تَرَكَـهُ ) کەبـریتین لە پیتی ( هـاء ) ەکە لەهەموویـان دا بـۆ خـواردنەکە دەگەڕێتەوە

## واتای فەرموودەکە

ئەبو هـوڕەیرە فەرموویەتی هەرگیز پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ڕەخـنەی لە خـواردن نەدەگـرت، ئەگەر حەزی بە خـواردنەکی بکـردایە دەیخـوارد، وە ئەگەر خـواردنەکەی پێ ناخۆش بوایێ وازی لێ دەهێنا و نەیدەخوارد

📖 واتـا پێغەمـبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ هەرگیـز کێشـەی دروست نەدەکرد لەسەر خـواردن ئەگەرچی پێشی نـاخۆش بوایێ و حەزی پێ نەکردایێ



## فەرموودەی ٣٣

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ أَفْضَلُ الْأَعْمَالِ الصَّلَاةُ لِوَقْتِهَا، وَبِرُّ الْوَالِدَيْنِ ﴾

### واتای وشەکان

أَفْضَلُ = چاکترین، باشترین

الْأَعْمَالِ = کردەوەکان، عیبادەتەکان

الصَّلَاةُ = نوێژ ، نوێژە

لِوَقْتِهَا = لەکاتی خۆی

وَبِرُّ = وە چاکەیە

الْوَالِدَيْنِ = باوک و دایک

### واتای فەرموودەکە

چاکترینی عیبادەت و کردەوەکان نوێژ کردنە لە کاتی خۆی دا، وە چاکە کردنە لەگەڵ دایک و باوک دا



## فەرموودەی ٣٤

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الْأُمِّ** ﴾

### و اتای وشەکان

**الْخَالَةُ** = خوشکی دایک، پلک، پور

**مَنْزِلَةِ** = شوێن و جێگا، پلەو پایە

**الْأُمِّ** = دایک

### و اتای فەرموودەکە

خوشکی دایک لەشوێن و جێگای دایکە



سێ ڕوون کردنەوە

1ـــ لە شـــەرع دا مـام لە پێشـــترە لە خـاڵ بەڵکـو لە شـوێن و جێگای باوک دادەنرێت هەروەکو **اللَّهُ تَعَالَى** فەرموویەتی

( أَمْ كُنْـتُمْ شُـهَدَاءَ إِذْ حَضَـرَ يَعْقُـوبَ الْـمَوْتُ إِذْ قَـالَ لِبَنِيـهِ مَـا تَعْبُـدُونَ مِـنْ بَعْـدِي قَـالُوا نَعْبُـدُ إِلَهَـكَ وَإِلَـهَ آبَائِـكَ إِبْـرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ )

سورة البقرة (١٣٣)

ســەیرکەن چــۆن مناڵەکـانی پێغەمــبەر یەعقــوب پێغەمــبەر (ئیســماعیل )یشــیان بە بــاوک نــاو هێنــاوە لەگەڵ وەشــدا ئیسماعیل مامی یەعقوب بووە نەک باوکی

2ـــ مام میراتت لێ دەبات لەکاتی خۆی دا بەڵام خاڵ میراتت لێ نابات

3 ـــ وە لە شـەرع دا خوشـکی دایـک لە شـوێن و جێگـای دایـک دادەنرێت نەک خوشکی باوک هەروەک پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی ( الْخَالَـةُ بِمَنْزِلَـةِ الْأُمِّ ) ئەگەرچی هەردووکیـان هەر پــورن، بەڵام خوشــکی دایــک ئەو ســۆزەت پــێ دەدات کە دایکت پێی ئەدای



## فەرموودەی ٣٥

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ ﴾

### واتای وشەكان

مَنْ = هەركەسێك

كَانَ = بوو

يُؤْمِنُ = بڕوا دەهێنێت، ئیمان دەهێنێت

بِاللَّهِ = بە **اللَّهُ تَعَالَى**

وَالْيَوْمِ الْآخِرِ = وە بەڕۆژی دوایی

فَلْيَصِلْ = با بگەیەنێت

رَحِمَهُ = خزمایەتییەكەی

### واتای فەرموودەكە

هەركەسێک باوەڕی هێناوە بە **اللَّهُ تَعَالَى** و بە ڕۆژی دوایی با پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت



## فەرموودەی ٣٦

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ ﴾

واتای وشەکان

مَنْ = هەرکەسێك

كَانَ = بوو

يُؤْمِنُ = ئیمان دەهێنێت، بڕوا دەهێنێت

كَانَ يُؤْمِنُ = بڕوای هەیە

بِاللَّهِ = بە اللَّهُ تَعَالَى

وَالْيَوْمِ الْآخِرِ = وە بەرۆژی دوایی

فَلَا يُؤْذِ = با ئەزیەت نەدا

جَارَهُ = دراوسێیەکەی



**فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ** = با ڕێزبگرێت لە میوانەکەی

**فَلْيُكْرِمْ** = با ڕێزبگرێت

**ضَيْفَهُ** = میوانەکەی

**فَلْيَقُلْ خَيْرًا** = باخێر و چاکە بڵێت

**فَلْيَقُلْ** = با بڵێت

**خَيْرًا** = چاکە

**أَوْ** = یان

**لِيَصْمُتْ** = بێدەنگ بێت

## واتای فەرموودەکە

هەرکەسێک بڕوای هەیە بە **اللَّهُ تَعَالَى** و بە ڕۆژی دوایی با دراوسێیەکەی ئەزیەت نەدات، وەهەرکەسێک بڕوای هەیە بە **اللَّهُ تَعَالَى** و بە ڕۆژی دوایی با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، وەهەرکەسێک باوەڕی بە **اللَّهُ تَعَالَى** و بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاک بکات یان بێدەنگ بێت

## فەرموودەی ٣٧

عَـنِ الْبَـرَاءِ بْـنِ عَـازِبٍ قَـالَ ﴿ كَانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْسَنَ النَّاسِ وَجْهًا، وَأَحْسَنَهُ خَلْقًا ﴾

**و اتای وشەکان**

كَانَ = بوو

رَسُولُ اللَّهِ = نێردراوی اللَّهُ تَعَالَى

أَحْسَنَ = جوانترین

النَّاسِ = خەڵک

وَجْهًا = ڕوو، دەم و چاو، ڕوخسار

وَأَحْسَنَهُ = وە جوانترینی خەڵک بوو

خَلْقًـــا = لەش و لاری، شـــكل و شـــێوەی، دروســـت کراوییەکەی

**و اتـــای فەرموودەکـــە:**-لەبەرائـــی کـــوڕی عـــازیبەوە کەفەرمـــوویەتی ( پێغەمـــبەر صَـــلَّى اللَّهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ جـــوانترین ڕوخســـاری هەبـــوو، وە لەهەمـــوو کەســـێک جوانتر بوو لەش و لار و شکل و شێوەی )



## فەرموودەی ٣٨

عَنْ أَنَسٍ قَالَ ﴿ **كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقًا** ﴾

### واتای وشەكان

**كَانَ** = بوو

**النَّبِيُّ** = پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**أَحْسَنَ** = جوانترین، چاكترین

**النَّاسِ** = خەڵك

**خُلُقًا** = خورەوشت

### واتای فەرموودەكە

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرموویەتی ( پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە هەموو كەس خو ڕەوشتی جوانتر بوو )



## فەرموودەی ٣٩

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ ﴿ **كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا** ﴾

### واتای وشەكان

**كَانَ** = بوو

**رَسُولُ اللَّهِ** = نێردراوی **اللَّهُ تَعَالَى**

**يَقْبَلُ** = قەبووڵی دەكرد، وەری دەگرت

**الْهَدِيَّةَ** = دیاری

**وَيُثِيبُ** = وە پاداشتی دەداوە

**عَلَيْهَا** = لەسەر دیارییەكە

### واتای فەرموودەكە

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ دیاری قەبووڵ دەكرد، وەپاداشتیشی لەسەر دەداوە{واتا پاداشتی دەداوە ئەو كەسەی كە دیاری پێ داوە}



## فەرموودەی ٤٠

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

﴿ **الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ** ﴾

### واتای وشەکان

**المَرْء** = مرۆڤ

**مَعَ** = لەگەڵ

**مَنْ** = ئەو کەسەیە

**أَحَبَّ** = خۆشی ویستووە

### واتای فەرموودەکە

مرۆڤ لە قیامەت دا لەگەڵ ئەو کەسە کۆدەکرێتەوە و حەشر دەکرێت کە لە دونیادا خۆشی ویستووە

جـا بـۆیە ئاگـادارbن و بـزانن کێتـان خـۆش دەوێـت ئەگەر جولەکەو گاورٍ و عەلمانی و طاغوتەکانتان خۆش دەوێن ئەوە موژدەتـان لێ بێـت لەگەڵ وان دا بـۆ دۆزەخ دەنێردرێن، **اللَّهُ تَعَالَی** لەخۆشەویستی ئەو کافرانە بمان پارێزێت

سوپاس بۆ **اللَّهُ تَعَالَی** ئەم فەرموودەیە کۆتا فەرموودەی ئەم نامیلکەیە بوو، **اللَّهُ تَعَالَی** سودی پێ گەیاندبن و ببێتە نوور و ڕوناکی بۆ قەبر و قیامەتمان

١٠ / ٨ / ٢٠٢٢ ڕۆژی چوارشەممە

✍أَبُو هَاجَرَةَ الكُرْدِي

